تصوير ابو عبدالرحمن الكردي
پەرەخان
هاوڕێی ئەستێرەکان
دارستانەکە
١
کۆمەڵە چیرۆکێکی منداڵان
داناني: واریسی ئەلکندی
وەرگێڕانی: سەرکەوڵ عیزەت مستەفا
دیزاین و جێبەجێکردن: کۆمپانیای نوور
منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

# پەرەخان

## هاوڕێی ئەستێرەکان

ناوی کتێب: پەرەخان هاوڕێی ئەستێرەکانە
دانانی: واریسی ئەلکندی
وەرگێڕانی: سەرگوڵ عیزەت مستەفا
هەڵەچن: ڕەووف مەلایی
بڵاوکراوەی: بوڕاق بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
دیزاین و جێبەجێکردن: کۆمپانیای نوور
نیگار: فیردۆس مونعیم
ڕەنگی ژمارەیی: مەلیحە حەسەن
سەرپەرشتی هونەریی: محەمەد ئەلقاسمی
تیراژ: ٥٠٠٠ دانە
ISBN: ٩٧٨-٩٦٤-١٩٢-٣٤٤-٢
چاپی یەکەم ٢٠١١


**ژمارەی سپاردن بە دەزگای کتێب و بەڵگەنامەکان- بەغدا (١٤٠٧) ساڵی ٢٠٠٩**
Web site: www.alburagh.com E-mail: Info@alburagh.com

لە شەوێکی مانگەشەوی خۆشدا، پەڵە هەورەکان بە ئاسمانی پڕ لە ئەستێرەی گەشەوە
دەبزوان، چەند ئەستێرەیەکی بچووک لە نێوان هەورەوە پێدەکەنی و بە هێمنی دەیدواندن
و ڕاسپاردەی ئەوەی دەکردن کە لەسەرخۆ یاری بکەن و غەڵبە غەڵب نەکەن تا خەڵک بێزار
نەبن و خەویان لێبکەوێ، پەرەخان ویستی لە پەنجەرەکەوە چاوی
بەم دیمەنە جوانە زاخاو بدات، هەر بۆیە بووکە شووشەکە
ی (نەر) لەسەر کورسییەکەی بەرامبەر بە پەنجەرەکە
دانیشت، پەرە بە نەرەی گوت.. ئەم مانگە هاوڕێمە و
پێش چەند ڕۆژێک دوو ئەستێرەی بچووکی پێشکەش
کردم و ئێستا لە ناو چاومدا دەبریسکێتەو... وتی: پەرە
ئەم دوو ئەستێرەیەت پێشکەش دەکەم،
کاتێک لە ئاوێنەدا سەیری
خۆت بکەیت، لە یادت
نەچم.

پەرە ئەو دوو ئەستێرە بریسکەدارەی نێو چاوی خۆش دەوێ، کە دەنوێت لە خەویدا بە ئاسمانەوە دەفڕی و یاری لەگەڵ مانگ و ئەستێرەکان دەکات، بەم جۆرە پەرە هەمیشە دڵشاد و بەختەوەرە...

بەڵام لەم ڕۆژانەدا پەرە نارەحەتە چونکە برایەکی بچووکی بەسەر هاتووە، هەر بۆیە هەست بە تەنهایی دەکات، ئەوەتا دایک و باوکی بایەخ بەو بچکۆلەیە دەدەن، ئەویش وا دەزانێ کە ئەویان زیاتر خۆشدەوێ، ئەوەتا لە بەر خۆیەوە دەڵێ خۆزگە ئەم بچکۆلەیە نەهاتبایەتە دنیاوە...

ئەڵبەتە پەرە هەموو شـەوێک خۆی و نەرەی بووکە شووشـەکەی لە بەردەم پەنجەرەکەدا دادەنیشـت و سـڵاوی لەمانگ و ئەسـتێرەکان دەکرد، لە مانگی دەپرسی: بۆ لەم ڕۆژانەدا باریک و کەوانەیی بویتەوە..

ئەوەتـا لاواز بویت و یەک شـەوەیت، پاش ئەوەی مانگـی چواردە بوویت؟ ئایا وەک مـن خەمناکـی، چونکە بـاوک و دایکـت منالێکی بچوکیان بـووە... مانگ وەڵامی پرسیارەکەی پەرە دەداتەوە و دەڵێ:

نەخێر پەرەخان تەنانەت قسـەکەت ڕاست نییە.. من لە سەرەتای هەر مانگێکدا وەک کەوانـە دەردەکـەوم، ئینجا تۆزە تۆزە گەورە دەبم، دەبم بەمانگی تەواو.

پەرەخان باوک ودایکت تۆیان خۆشدەوێ و قسـەکانت لـە خەیاڵـی خۆتدایـە، پـەرە گوێی لە وەڵامـی مانـگ نەبـوو، وتـی: قسـەکانت ڕاسـت نیین.

ڕۆژێکیان پەرە لە ژوورەکەیدا لەگەڵ نەرەی بووکە شووشەیدا یاری دەکرد، لەو کاتەدا دایکی خۆی کرد بە ژوردا و وتی: ئازیزم پەرە ئایا دەتوانی ئاگات لە برا بچوکەکەت بێ؟ چونکە ئەمرۆ تووشی هەڵامەت بووم و بە کاریماڵەوە خەریکم..

پەرە بە دڵتەنگییەوە وتی: نەخێر برای بچوکم ناوێ، تەنانەت ئەویش نازانێ یاری بکات یان قسەم لە گەڵ بکات...

دایکی لە وەڵامی پەرە دڵتەنگ بوو، لە ژورەکە دەرچوو..

ئێـواران پـەرە دەیڕوانییە
مانـگ و ئەسـتێرەکان و
ئەیدوانن، بەڵام ئەو ئێوارێیە
مانـگ و ئەسـتێرەکان زۆر
غەمبـار بـوون و نەیدیـن،
پەرە لەبـەر خۆیـەوە وتی:
ئاخۆ مانگ و ئەستێرەکان بۆ
کوێ چـوون؟! پەنجەرەکەی
بـە جێهێشـت و لـە سـەر
جێگاکـەی پاڵکەوت و بڕیاری
دا سـبەینێ لەگـەڵ دوو
ئەسـتێرەکەی ناوچاوی قسە
بـکات و پرسـیاری مانگ و
ئەسـتێرەکانی لـێ بـکات...
کاتێـک بەیانـی هەڵسـاو
دەموچـای شـت و ڕووی
کردە ئاوێنەکە دوو ئەستێرە
بچوکەکە لـە چاویدا بەدی
نەکـرد، ئەڵبەتـە ئەمە زۆر
غەمباری کرد.

پەرە لە جێگاکەیدا و لە ژێر سەرین و سەر زەوی و لە نێوان بووکە شووشەکانیدا بە بێ ئەنجام بۆ دوو ئەستێرەکە گەڕا، دایکە نەخۆشەکەی هاتە ژووری و سەیری کرد، هەموو شتێک بەو ناوەدا بڵاو بۆتەوە و جلەکانی پەرە پیسن..

دایکە وتی: ئازیزم پەرە گەر تۆ یارمەتیم نەدەیت لە کاروباری ماڵدا و تەنانەت ژوورەکەشت بەم جۆرە بڵاو بکەیتەوە، ئەرکم زیاتر دەکەیت، دەسا هەڵسە و چاودێری براکەت بکە تا من دەرمانەکەم دەخۆم وکارەکان ئەنجام دەدەم... پەرە گوێی نەدایە قسەکانی دایکی ... دایکە دەرمانەکەی خوارد و دەستی کرد بە پاک کردنەوەی ناوماڵ، ئەڵبەتە بچوکەکەشی هەر بە باوەشەوە بوو.. پەرە تەنها بیری لەخۆی دەکردەوە و عەودالی دۆزینەوەی دوو ئەستێرەکەی بوو...

کاتێـک ئێواره داهاتەوه، پەره لە تەنیشـت پەنجەرەکەوه
دانیشـتەوه مانگ و ئەستێرەکانی دی، هەستی بەخۆشی
کرد و پرسـیاری لە مانگ کرد، ئایا ئەستێرەکانت دیوه؟
مانگە لە ئاسـماندا گەڕا بە شـوێن ئەسـتێرەکانی پەرەدا
بـەڵام بێسـود بـوو، ئینجا لە پەرەی پرسـی کـەی دوو
ئەستێرەکەت ون کرد؟ پەره وتی: لەو کاتەوەی
کە دایکم وتی نەخۆشم و یارمەتی تۆم دەوێ کە
بایـەخ بـە بچکۆلەکـە بدەم منیـش رازی
نەبووم چونکە ئەو بچکۆلەیەم خۆش ناوێ..
مانـگ دڵزویر بوو، خـۆی لەنێوان
هـەوردا شـاردەوەو بـە بێدەنگی
خۆی دەردەخسـت و ئینجا گوتی:
مـن ئەو منداڵانەم خۆش ناوێ کە
یارمەتی دایک و باوکیان نەدەن و
جارێکیتـر خـۆی و ئەسـتێرەکان
خۆیان شاردەوه..
٨

پەرە کەوتە بانگەواز لێکردنی مانگ و ئەستێرەکان، بەڵام وەڵامیان نەدایەوە. خەمبار بوو چونکە هیچ هاوڕێیەکی نەماو، بە تەنها مایەوە هەر بۆیە بیری کردەوە و وتی: قسەکانی مانگ زۆر بەجێن، چونکە من منداڵێکی گوێ ڕایەڵ نیم، هەر بۆیە هەر دوو ئەستێرەکانی نێو چاوم و مانگ و ئەستێرەکانیترم لێ زویر بوون وا هەموویان خۆیان شاردەوە.

دەبێ ئەو هەڵەیە ڕاست کەمەوە، تا هاوڕێکانم بگەڕێنەوە، پەرە چووە لای دایکی سەیری کرد نووستووە و گیانی زۆرگەرمە، برا بچووکەکەی لە بێشکەکەیدا دەگری... خێرا جامی ئاوی سارد و پارچە قوماشێکی پاکی ئامادە کرد و لە ئاوە ساردەکەی هەڵکێشا و خستیە سەر ناوچەوانی دایکی تا تاکەی ئەهوەن کاتەوە، ئەوەی چەند جارێک دووبارە کردەوە، دایکی چاوی هەڵبڕی. بەر بەرە تاکەی سووک بۆوە، دایکی وتی: ئازیزم پەرە سوپاس بۆ یارمەتیکەت، پەرە بزەیەکی کرد و بە شەرمەوە وتی: من هەڵە بووم دایکە، چونکە وامدەزانی تۆ و باوکم برا بچووکەکەمتان زیاتر خۆش دەوێ و هەستم بە ئیرەیی دەکرد، ئینجا دەرمانەکانی دا بە دایکی..

دایکە وتی: بەو جۆرە بیر مەکەرەوە، ئێستا گەورەیت، من و باوکت براکەتمان وەک تۆ خۆش دەوێ و جیاوازی ناکەین لە نێوانتاندا، بەڵام بچووکەکە ناتوانێ قسە بکات و بڕوات و پێویستی بە چاودێری زیاترە ئازیزم.
پەرە بە شەرمەوە بزەیەک گرتی و باوەشی بە دایکیدا کردو و ماچی کرد.

پەرە لەگەڵ براکەیدا یاری کرد و بێشکەکەی ڕاژەن و سرودێکی بۆ خوێندەوە، سەیری دەموچاوی کرد، جوان بوو.. بچکۆل پێدەکەنی و ئغەئغەی دەکرد و پەنجەی گرت.. هەر بۆیە پەرە سەری دانا و ویستی ماچی بکات، ئا لەو کاتەدا هەر دوو ئەستێرەکەی لە چاویدا بەدی کرد، زۆر خۆشحاڵبوو، گرتییە باوەش و ماچی کرد و بردییە لای پەنجەرەکەوە تا بە مانگ و ئەستێرەکان بڵێ هەر دوو ئەستێرەکەی لە نێو چاوی برا ئازیزەکەیدایە..

ئەمە لەبەر کە

پێغەمبەر ( د.خ ) دەفەرموێ

## گومان نەکردن لەپتەوی پەرستنەوەیە

لەم چیرۆکە خۆشەدا پەرەمان ناسی... ئەو کچکۆلە جوانە کە گومانی لە دایک وباوکی دەکرد، گوایە لە دایکبووە تازەکەیان خۆشتر دەوێ و لە ئەنجامدا زانی کە هەڵەیە و دایک و باوکی وەک جاران خۆشیان دەوێ. هاوڕێیان با لەم چیرۆکەوە فێربین و بە خراپە گومان لەکەس نەکەین

پەرەخان

شوێنی ئەو چوار پارچەیە بزانە کە لەخوارەوە دانراون و ژمارەکانیان بخەرە ناو ئەو بازنانەوە..